إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاَللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

**وَبَعْد:**

ئەمە چەند ڕونکردنەوەیەکی کورتە دەربارەی هەندێك بابەتی تایبەت بە ئافرەتان کە پێویستییانە لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا یان لە پێش ڕەمەزان یان لە دوای ڕەمەزان، وە ئەم باسانە ئافرەتان پرسیاری دەکەن و دوبارە دەبێتەوە، وە بە کورتی باسم کردووە، تاوەکو ئاسان بێت إن شاء الله، وە خوای گەورە -سُبحانَهُ وتعالی- تەنها خۆی دەتوانێت سود بگەیەنێت پێی.

بۆیە لە سەرەتادا دەڵێم: زانراوە کە ڕۆژووگرتن خۆگرتنەوەیە لەو شتانەی ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە بەهەموو جۆرەکانییەوە، لە دەرچوونی فەجری ڕاستگۆ، تا خۆرئاوابوون، وە دیارنەمانی قورصی خۆر، وە لەم نێوانەدا هەندێك بابەت پەیوەندی بە ئافرەتانەوە هەیە حوکمدان تێیدا زۆر ڕوون نییە بۆیان، جا ئایە ئەمە دەچێتە ژێرئەوەی ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە یان نا؟ بۆیە باسکردنی ئەم بابەتانە پشتیوان بە خوای گەورە دەبێتە هۆکاری ئەوەی بەرچاو ڕوونی زیاتر بدات بە ئافرەتان لەو بابەتانە.

**بابەتی یەکەم:** ئەوەی لەم بابەتەدا باس دەکرێت ئەوەیە کە: زانایان خیلافیان هەیە لەسەر بینینی مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان لەلایەن ئافرەتەوە، ئەوەی ئاشکرابێت لە وتەی زانایان ئەوەیە: ئەگەر ئافرەت مانگ ببینێت شایەتیدانەکەی وەردەگیرێت، ئەمە وتەی أبو حنیفەیە وە حەنبەلییەکانیش کاری پێدەکەن، وە لای شافعییەکانیش، وە بەڵگەشیان ئەوەیە ئەمە حوکمێکی شەرعییەو جێی دەبێتەوە لە بواری شایەتیدان، وە شایەتیدانی ئافرەتیش وەردەگیرێت ئەگەر عوزرێك نەبێت، یان بەڵگەیەك یان گومانێك نەبێت لەسەر بەتاڵێتی شایەتیدانەکەی.

**بابەتی دووەم:** هەر ئافرەتێك ڕۆژووی قەرزی لەسەربوو وە ڕۆژووەکانی نەگرتەوە تا نیوەی شەعبان، ئەوا دەتوانێت بەڕۆژوو بێت، وە ئەمە ناچێتە ژێر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: "کاتێك گەیشتە نیوەی شەعبان بەڕۆژوو مەبن"(١). لەبەرئەوەی ڕۆژووی قەرزە، وە واجبێکەو حەقێکە لەسەری دەبێت بیگرێتەوە، پێش ئەوەی ڕەمەزانێکی تر بێتەوە.

**بابەتی سێ یەم:** هەر ئافرەتێك ڕۆژووی لەسەربێتو نەیگرێتەوە تا ڕەمەزانێکی تر دێت، ئەوا لە دوو حاڵەت تێناپەڕێت:

**یەکەم: ڕۆژووەکەی نەگرتووەتەوە لەبەر هۆکارێکی شەرعی:**

ئافرەتێك ڕۆژووەکەی شکاندووە لە ڕەمەزاندا وە ڕۆژووەکەی نەگرتووەتەوە تا ڕەمەزانێکی تر هاتووەتەوە، ئەوا لە دوو حاڵەت تێناپەڕێت: یەکەم: هۆکارێکی شەرعی وەکو نەخۆشی، یان شیردان بە منداڵ، یان سکپڕی، یان سەفەر، ئەوا بەڕۆژوو دەبێت پێش ئەو ڕەمەزانەو کەفارەتی لەسەرنییە.

**حاڵەتی دووەم: ڕۆژووەکەی نەگرتووەتەوە بەبێ هۆکارێکی شەرعی:**

ئەوا کەفارەتی دەکەوێتە سەر بەهۆی دواخستنی، هەروەکو چۆن ابن عباسو ابن عمر،و أبو هورەیرە (ڕەزای خوایان لێبێت) فەتوایان لەسەرداوە، ئەو کەفارەتەیش خواردنی هەژارێکە بۆ هەر ڕۆژێك، وە واجبە لەسەری لە دوای ڕەمەزان ئەو قەرزانەی بگرێتەوە.

**بابەتی چوارەم:** زانایان یەکدەنگن کە ئافرەتێك لە سوڕی مانگانەو زەیستانیدا بوو ئەوا ڕۆژووی لەسەر نیەو نوێژیش ناکات، وە دروستیش نیە ڕۆژوو بگرێتو نوێژ بکات، لەبەر فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ: "ئایە نازانیت کاتێك کە ئافرەت کەوتە سوڕی مانگانە نوێژ ناکاتو ڕۆژوو

---

(١) حديث صحيح: أخرجه أبو داود. سنن أبي داود (٢٣٣٧).

ناگرێت"[(٢)] بۆیە دروست نیە بۆ ئافرەتێك كە لە سوڕی مانگانەو زەیستانیدا بێت ڕۆژوو بگرێت یان نوێژ بكات، وە تاوانبار دەبێت ئەگەر ئەنجامی بدات.

**بابەتی پێنجەم:** ئافرەتێك لە شەوی ڕەمەزاندا لە سوڕی مانگانەدا بێت پاشان پاك ببێتەوە لە بەیانییەكەیدا، ئایە ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبێت یان نا؟ بۆ نموونە: ئەگەر پاكبووەوە لە نیوەڕۆ ئایە خۆی دەگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە تا ئێوارە؟

ڕاسترین وتە لە وتەی زانایان ئەوەیە كە خۆی ناگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە، كە ئەمە مەزهەبی مالكی و شافعی یە (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) وە بەڵگەشیان ئەوەیە لە بنچینەدا ئەستۆی پاكەو تەكلیفی لەسەر نییە، مادەم كە دەبێت ئەو ڕۆژە بگرێتەوە، ئیتر چۆن دەبێت دەست هەڵبگرێت و ئەو نیو ڕۆژە بەڕۆژوو بێت، وە ئەوانەی دەڵێن: دەست دەگرێتەوەو بەڕۆژوو دەبێت دەڵێن: لەبەر ڕێزی ئەو مانگەیە، بەڵام ڕاست ئەوەیە كە بەڕۆژوو نابێت، وە تەكلیف ناكەوێتە سەری و دەست بگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە كە ئەمە حوكمێكی زیادەیەو پێویستی بە بەڵگەیە، وە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆربووە ئەگەر حوكمێك هەبووایە لەسەری ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری دەدا.

**بابەتی شەشەم:** ئەگەر ئافرەتێك لە ڕۆژی ڕەمەزاندا كەوتە سوڕی مانگانەوە بە چەند دەقیقەیەك پێش خۆرئاوابوون، ئەوا ڕۆژووەكەی بەتاڵ دەبێتەوە بە یەكدەنگی زانایان، وە دەبێت ئەو ڕۆژە بگرێتەوە.

**بابەتی حەوتەم:** جیماع كردن لە ڕۆژدا لە مانگی ڕەمەزان ئەوا ڕۆژووەكە بەتاڵ دەكاتەوە، بە یەكدەنگی زانایان، بەهەمان شێوە كەسێك مەنی خۆی بێنێتەوە بە هەر شێوەیەك ئەوا ڕۆژووەكەی بەتاڵە، كە ئەمەش زانایان كۆ دەنگن لەسەری، وە قسەی ئەو كەسەش وەرناگیرێت كە

---

(٢) أخرجه البخاري. (٣٠٤).

پێــچەوانەی ئەمــە بڵــێ چــونکە پێــچەوانەی ئیجمــاعی کــردووە، ئــەوەی کــە جیمــاع دەکــات بــە ئەنقەســت ئــەوا کــەفارەتێکی قــورس دەکەوێتــە ســەری، ئــەویش ئــازادکردنی کۆیلەیەکــە یــان دوو مــانگ بــەڕۆژوو دەبێــت لەســەر یــەك، یان خواردنی شەست فەقیر بدات، لەسەر ئەو تەرتیبەی کە باسکرا.

وە خــیلاف هەیــە لــە نێــوان زانایــان ئایــە ئافرەتەکــەش کــەفارەت دەکەوێتــە ســەری یــان نــا؟ یــاخود تــەنها کەفارەتەکــە لەســەر پیــاوە بەتــەنها؟ ئــەوەی ئاشـکرابێت لـە وتـەی زانایـان کـەفارەت تـەنها لەسـەر پیـاوەو لەسـەر ئافرەتەکـە نیـە، ئەگەرچـی پتـەوتر ئەوەیـە کـە ئافرەتەکـەش کـەفارەت بـدات لەبـەر بـوونی بەهێزی بەڵگە، وە لەبەر ئەو خیلافە بەهێزەی لە نێوان زانایان هەیە[٣].

**بابــەتی هەشــتەم:** هــەر پیاوێــك زۆر لــە خێزانەکــەی بکــات بــۆ جیمــاع کــردن وە ئافرەتەکــە نــەتوانێت بــەرگری لــە خــۆی بکــات، ئــەوا نــە ڕۆژووەکــە دەگرێتــەوە وە نەکەفارەتیــشی لەســەرە کــە ئەمــە ڕاســتترو تــەواوترە لــە وتــەی زانایـــان، وە ئەمـــە مەزهـــەبی شـــافعیو أبـــي ثـــورو ابـــن المنـــذرو وە وتەیـــەکی ئیمــامی ئەحمــەدە (ڕەحمــەتی خوایــان لێبێــت) خــوای گــەورەش لــە قورئانــدا فەرموویـــــەتی: ﴿رَبَّنَـا لَا تُؤَاخِـذْنَا إِنْ نَـسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَـا﴾ [البقـرة: ٢٨٦]. واتـــە: ئـەی پـەروەردگار هـەر شـتێك کـە لـەبیرمان کـرد یـان بەهەڵـە کردمـان تـۆ لێمـان مـەگرە وە سـزامان مـەدە لەسـەری. (تەفـسیری ڕێبـەر، ئامـادەکردنی: م. صـلاح الــدین عبــدالکریم). وە پێغەمبــەری خــواش ﷺ فەرموویــەتی: "خــوای گــەورە لەســـەر ئوممەتەکـــەمی هـــەڵگرتووە: هەڵـــە، وە لەبیرچـــوون، وە ئـــەوەی کـــە بەزۆر پێی بکرێت"[٤].

**بابــەتی نۆیــەم:** ئەگــەر کەسـێك لەگــەڵ خێزانــی جیمــاعی کــردو وا گومــانی بــرد کــە هێــشتا فــەجری بــەیانی دەرنەچــووە، پاشــان بــۆی دەربکــەوێت کــە

---

(٣) کەفارەت ناکەوێتە سەر ئافرەتەکە، وەکو ڕوداوی (سەلمەی کوڕی صەخر – صحیح البخاري (١٨٣٤)). – وەرگێڕ–.

(٤) حديث صحيح: أخرجه ابن ماجة. سنن ابن ماجة (٢٠٤٥).

فەجر دەرچووە، ئەوا قەزاکردنەوەی لەسەر نیە، وە کەفارەتیشی لەسەر نییە کە ئەمەش مەزهەبی شافعییە (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، لەبەرئەوەی لە بنچینەدا هێشتا شەو تەواو نەبووە.

**بابەتی دەیەم:** ئەگەر -جیماع-یان کرد وە هەردووکیان وا گومانیان برد خۆر ئاوابووە، دوایی بۆیان ڕوون بووەوە خۆر ئاوا نەبووە ئەوا دەبێت ئەو ڕۆژە قەزا بکەنەوە، بەڵام کەفارەتیان لەسەرنییە، لەبەرئەوەی لە بنچینەدا هێشتا ڕۆژ تەواو نەبووە، کە وتمان کەفارەتیان لەسەرنییە؛ لەبەرئەوەی عوزریان هەیە چونکە بە دەستی ئەنقەست نەیان ویستووە بێڕێزی بکەن بەرامبەر ئەو مانگە، ئەمە ئاشکراترە، واللهُ أَعلم.

**بابەتی یانزە:** ئەگەر ئافرەتێک هەستی بە ئازاری سوڕی مانگانەکەی کرد لە ڕۆژدا، ئەوا بەردەوام دەبێت لەسەر ڕۆژووەکەی، هەرچەندە ئازارەکەی زیاد بکات، لەبەرئەوەی هێشتا نەکەوتووەتە سوڕی مانگانەوە، یان خوێنی نەبینیوە.

**بابەتی دوانزە:** ئەگەر ئافرەت پێش دەرکەوتنی فەجر لە سوڕی مانگانە پاك بووەوەو خۆشوشتنەکەی خستە دوای دەرکەوتنی فەجر، ئەوا ڕۆژووەکەی دروستە، وە ئەمە قیاس دەکرێتە سەر لەشگرانی، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەشگران دەبوو لە شەوداو دەخەوت، پاشان دوای فەجر (پێش نوێژی بەیانی) خۆی دەشوشتو غوسڵی دەردەکرد.

**بابەتی سیانزە:** ئەگەر کەسێك ڕۆژووی شکاند لە ناو مانگی ڕەمەزان لەبەر عوزرێکی شەرعی پاشان چووە ناو مانگی شەوال، ئایە بۆی هەیە سوننەتەکە بگرێت پێش ڕۆژووە قەرزەکەی یان دروست نییە بۆی؟

زانایان خیلافیان هەیە، پەسەندترو پتەوتر ئەوەیە کە واجبەکە دەگرێت پێش ڕۆژووە سوننەتەکە، واجب پێش دەخرێت بەسەر سوننەتدا لەگەڵ بوونی توانا.

**بابەتی چواردە:** ئەگەر ئافرەتێك ڕۆژووی نەگرت بەهۆی شیرپێدانی بە

منداڵ یان سکپڕی، وتەی تەواوی زانایان ئەوەیە کە ویستی خۆیەتی ڕۆژووەکە دەگرێتەوە یان خواردن دەدات بە فەقیر کە بۆ هەر ڕۆژێك خواردنی فەقیرێکە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوە فەتوای ابن عباس و ابن عمر (ڕەزای خوایان لێبێت) وە هیچ صەحابەیەکی تر ( ڕەزای خوایان لێبێت) پێچەوانەی ئەمەیان نەوتووە.

**بابەتی پانزە:** دروستە بۆ پیاوو ژن ماچی یەکتر بکەن لە کاتی بەڕۆژووبوون بەڵام ئەمین بن لە فیتنە، زیان نەدات لە ڕۆژووەکەیان، کە ئەمە لە فەرموودەی دایکی باوەڕداران عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) باسی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات دەفەرمووێت: " پێغەمبەری خوا ﷺ لە خێزانەکانی نزیك بووتەوە لە کاتی بەڕۆژوو بوونیدا"[(٥)] مەبەست پێی بەریەك کەوتن‌و دەست لە یەکدانە.

**بابەتی شانزە:** کاتێك ئافرەتێك پاك بووەوە لە زەیستانی پێش چل ڕۆژ لە مانگی ڕەمەزان، ئەوا دەبێت بەڕۆژوو بێت؛ لەبەرئەوەی پەندوەرگرتن بە کۆتایی هاتنە بە خوێنەکە، بۆیە واجبە بەڕۆژوو بێت، بەڵام ئەگەر خوێن بەردەوام بوو لەسەروی چل ڕۆژەوە، لە ناو مانگی ڕەمەزان؛ ئەوا واجبە خۆی بشوات لە چل ڕۆژەکە، لەبەر وتەی ئوم سەلەمە (ڕەزای خوای لێبێت) لەسەر ئەمە، چونکە چل ڕۆژ کۆتایی زەیستانی یەو لەوە زیاتر نیە.

**بابەتی حەڤدە:** بەکارهێنانی کل‌و بۆن‌و بخورو ئەوانەی بۆ جوانکاری بەکاردێت ڕۆژوو بەتاڵ ناکەنەوە لەسەر وتەی تەواو؛ لەبەرئەوەی هیچ

---

(٥) أخرجه مسلم. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ : " كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُقَبِّلُ وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ. "رواه البخاري (١٩٢٧) ، ومسلم (١١٠٦).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی خێزانەکانی دەکردو بەڕۆژووش بوو، وە لێیان نزیك دەبووەوەو بەڕۆژوو بوو، بەڵام لە هەمووتان زیاتر توانای هەبوو بەسەر خۆیدا.

بەڵام کەراهەتی هەیە بۆ کەسێك بترسێت لە خۆی کە توشی جیماع ببێت یان ئاوی بێتەوە. وە وتراوە: بە هەموو شێوەیەك کەراهەتی هەیەو نابێت ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکرێتە قیاس، چونکە توانای هەبووە بەسەر خۆیدا. (مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المفاتيح: رقم الحديث: (٢٠٠٠)). (وەرگێڕ).

بەڵگەیەکی ڕاست لەسەری نەهاتووە کە ڕۆژوو بەتاڵ بکاتەوە، وە بەکارهێنانی کل دەکرێتە چاو نەك لە شوێنێك بکرێت کە شوێنی خواردن بێت.

**بابەتی هەژدە:** ئافرەتان بەزۆری پشکنینی بۆریچکەی منداڵان ئەنجام دەدەن، وە ئەمە لەسەر وتەی تەواو ئەوەیە کە ڕۆژوو ناشکێنێت وە کاریگەری نییە لەسەر ڕۆژووەکەی، لەبەرئەوەی ئەمە وەکو جیماع نییە.

**بابەتی نۆزدە:** دروستە بۆ ئافرەت کە تامی خواردن بکات بێئەوەی بچێتە قورگی یەوە، چونکە گەیشتە قورگی ئەوا ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی تامکردنی خواردن ڕۆژوو ناشکێنێت وەکو ئاو لە دەم وەردانو لوت وەردانە لە کاتی دەستنوێژدا؛ چونکە ئەوانە ڕۆژوو ناشکێنن.

**بابەتی بیست:** کەڕاهەتی هەیە کە ئافرەت دەرمان بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی توشی سوڕی مانگانە نەبێت تا ڕۆژووەکەی بگرێت، ئەگەر ئەوەی کرد ڕۆژووەکەی تەواوە، ئەگەر خوێن نەبینێت، وە هیچی لەسەر نیە.

ئەم بابەتانەم باس کرد بە کورتی کە تایبەتە بە ئافرەتی موسڵمانەوە لە مانگی ڕەمەزان.

داوا دەکەم لە خوای گەورە سود بە ئافرەتانی موسڵمانان بگەیەنێت وە سودەکەی بۆ هەمووان بێت، خوای گەورە بەخشندەو خاوەن چاکەیە.

٤ رمضان ١٤٤١ کۆچی - وەرگێڕ